غەزەلنووس

لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی
ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی کتێب ٤١

# مەسخ

ڕۆمان

## فرانس کافکا

**پێشەوا فەتاح**
**لە ئەڵمانییەوە کردوویە بە کوردی**


- بەرگ: نیکۆلاس گرینەری
- چاپ: دووەم- ٢٠١٤
  ڕێنووس و هەڵەچنیی نوێ
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٣٠٠٠ هەزار دینار
- بڵاوکار: ناوەندی غەزەلنووس- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ١٧٣٩ی ساڵی ٢٠١٤ی پێ دراوە

**سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە**
Die Verwandlung
Franz Kafka

# مەسخ

## فرانس کافکا

پێشەوا فەتاح

لە ئەڵمانییەوە کردوویە بە کوردی

## بەشی یەکەم

**گریگۆر سامزا** بەیانییەک لە خەونگەلێکی بێئارامەوە بەخەبەر هات و خۆی لەناو جێگاکەیدا بە ڕموزنبوویی بینییەوە. لەسەر پشتە سەدەفئاسا ڕەقەڵەکەی پاڵ کەوتبوو و کاتێک سەری خۆی کەمێک بڵند دەکرد، زگە قەوسە قاوەییەکەی خۆی دەبینی، کە بە درزی کەوانەیی کەرتکەرت بووبوو و پێخەفەکەشی بە ئەستەم پێوە مابوو و وەخت بوو تەواو دەخزایە خوار. قاچە زۆرەکانی، کە بە بەراورد لەگەڵ چێوەی ئاساییدا بە شێوازێکی ئابڕووبەرانە باریکەڵە بوون، دەستەپاچانە لە پێش چاویدا دەبریقانەوە.

بیری کردەوە: «من چیم بەسەر هاتووە؟» خەون نەبوو. ژوورەکەی، ژوورێکی ڕاستەقینە، بەڵام کەمێک چکۆلانەی مرۆڤێک، هێشتا لە نێوان چوار دیوارە ئاساییەکانیدا بوو. بەسەر مێزەکەدا، کە پاکەتێک خاولیی نموونەیی هەڵپچڕاو بڵاو کرابووەوە- **سامزا** کاری گەشتکردن بوو- ئەو وێنەیە هەڵواسرابوو، کە لەمێژ نەبوو ئەم لە گۆڤارێکی تایبەت بە وێنەوە بڕیبووی و خستبوویە چوارچێوەیەکی قەشەنگی زێڕینەوە. وێنەکە خانمێکی نیشان دەدا، کە بە کڵاو و ملپێچێکی چەرم خۆی ڕازاندبووەوە، بە قیتوقنجی دانیشتبوو و دەسکێشێکی چەرمیشی لە ڕووی بینەردا ڕاگرتبوو، کە تێیدا بەشی خوارەوەی پەلی بە تەواوی ون بووبوو.

پاشان نیگای **گریگۆر** کەوتە سەر پەنجەرەکە- مرۆڤ گوێی لە ترپەی بارانەکە دەبوو دەیدا بە تەختی کانزایی پەنجەرەکەدا- ئەو کەشوهەوا غەمگینە تەواو مات و مەلوولی دەکرد. بە خۆی گوت: «چۆنە گەر کەمێکی دیکە بخەوم و ئەم هەموو شێتیوشوورییە فەرامۆش بکەم.»، بەڵام ئەوە کارێکی تەواو نەکردە بوو، چونکە **گریگۆر** ڕاهاتبوو لەسەر لای ڕاست بخەوێت، بەڵام لەم دۆخەی ئێستایدا خۆی پێ نەدەچووە سەر ئەو بارە. بە هەر هێزێک خۆی فڕێ دەدایە سەر لای ڕاست، هەمیشە دەکەوتەوە سەر پشت. هەڵبەت سەد جار تاقی کردەوە، چاوی لێک نا تاکوو پێویست نەکات لینگەفرتێکانی خۆی

پێشنیوەڕۆدا بۆ میوانخانەکە بگەڕێمەوە، تاکوو ئەو کار و ڕاسپاردانەی دەستم کەوتوون بنووسمەوە، ئەو ئاغایانە سەرەتا لە بەرچاییدان. با من ئەوە لەگەڵ خاوەنکارەکەی خۆمدا تاقی بکەمەوە؛ وەڵا دەستبەجێ دەردەکرێمە دەرێ. جا کێ دەڵێت ئەوە بۆ من خەراپە. گەر لەبەر خاتری دایک و باوکم خۆم دوور ڕانەدەگرت، لەمێژ بوو دەستم لە کار کێشابووەوە، دەڕۆیشتمە بەردەمی خاوەنکارەکە و ڕای خۆمم لە ناخی دڵەوە پێ دەگوت. جا با بۆ خۆی لەسەر مێزەکەی خۆی بەربوایەتەوە خوارێ! ئێ ئەوە شتێکی سەیرە، لەسەر مێز دانیشیت و لە سەرەوەوە بەرەو خوار قسە بۆ کارمەندێک بکەیت، کە دەبێت وێڕای ئەوەش لەبەر ئەوەی خاوەنکارەکە گوێی گرانە تەواو نزیک بێتەوە. ئیدی هێشتا هیوا ماوە؛ کە پارەکەم پێکەوە نا، تاکوو قەرزی دایک و باوکمی پێ بدەمەوە- دەکرێت پێنج تا شەش ساڵی دیکە بخایەنێت-، هەر دەبێت ئەوە بکەم. ئەوکات گۆڕانێکی مەزن ڕوو دەدات. بەڵام دەبێت جارێ من هەستمە سەرپێ، چونکە شەمەندەفەرەکەم کاتژمێر پێنج دەردەچێت.»

تەماشای کاتژمێرەکەی ئەوبەرەوەی کرد، کە لەسەر سندووقەکەوە چرکەی دەهات. لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەی باوکی ئاسمانی!» کاتژمێر شەشونیو بوو و میلەکانیش پەیتاپەیتا بەرەو پێش دەچوون، تەنانەت لە نیویش لای دابوو، لە سێ چارەگ نێزیک دەبووەوە. ئەی نەدەبوو

میقاتەکە زەنگی لێ بدایە؟ مرۆڤ لە جێگاکەوە دەیبینی، کە بۆ سەعات چوار بە دروستی میقات کرابوو؛ بێشک زەنگیشی لێ دابوو. بەڵێ، بەڵام ڕێی تێدەچوو مرۆڤ بەو زەنگە دیوارلەرزێنە بەخەبەر نەیەت؟ خۆ خەوێکی ئارامیش نەخەوتبوو، بەڵام لە جێی ئەوە خەوێکی قووڵتر. بەڵام دەبایە ئێستا چی بکات؟ شەمەندەفەری داهاتوو کاتژمێر حەوت دەردەچوو؛ بۆ ئەوەی پێی ڕابگات، دەبایە پەلەپەلێکی شێتانە بکات و نموونەکان هێشتا کۆ نەکرابوونەوە و خۆیشی هەستی بە زیندوویی و بزێوییەک نەدەکرد. تەنانەت گەر فریای شەمەندەفەرەکەش بکەوتایە، لە دەست هاتوهاواری خاوەنکارەکەی کە وەک هەور دەگرمێنێت ڕزگاری نەدەبوو، چونکە خزمەتکاری ناو دوکانەکە لای شەمەندەفەری سەعات پێنج چاوەڕێی کردبوو و لەمێژ بوو نەهاتنی ئەمی ڕاگەیاندبوو. ئەو مەخلووقێکی بێسروشت و بێمێشکی خاوەنکارەکە بوو. ئەی چۆن بوو خۆی بە نەخۆش بنووسێت؟ بەڵام ئەوە ئەوپەڕی شەرمەزاری و جێی گومان دەبوو، چونکە **گریگۆر** لە ماوەی دەوامی پێنجساڵەیدا هەرگیز بۆ جارێکیش چییە نەخۆش نەکەوتبوو. بێشک خاوەنکارەکەی لەگەڵ دکتۆری «کۆمپانیای دڵنیایی نەخۆش» دەهات، دایک و باوکی لەسەر کوڕە تەمبەڵەکەیان تۆمەتبار دەکرد و لە ڕێی ئاماژەی ئەو پزیشکەوە، کە بە ڕای ئەو تەنها مرۆڤی

تەواو تەندروست، بەڵام کارنەکەر بوونیان هەیە، ڕێی هەموو بەرپەرچدانەوەیەکی لێ دەگرتن. ئەی بۆ تێبینی، ئایا لەم حاڵەتەدا دکتۆرەکە لەسەر هەق نەدەبوو؟ لە ڕاستیدا **گریگۆر**، خەواڵوویەکی بەڕاستی بێسوودی پاش خەوێکی دوورودرێژی لێدەرچێت، هەستی بە ئاسوودەیی و تەنانەت بە برسییەتییەکی زۆریش دەکرد.

کاتێک لە پەلەپەلییەکی زۆردا، بێئەوەی بتوانێت بڕیار لەسەر جێهێڵانی جێگاکەی بدات، بیری لەو هەموو شتانە کردەوە- لەو ئانوساتەدا میلی کاتژمێرەکە کەوتە سەر چارەگی بوێت بۆ حەوت- کەسێک لەسەرخۆ لە دەرگای ژوورەکەی دا.

دەنگێک بانگی لێکرد: «**گریگۆر!**»- دایکی بوو- «کاتژمێر چارەکی دەوێت بۆ حەوت، ناتەوێت بکەویتە ڕێ.»

ئەو دەنگە نەرمونیانە! **گریگۆر**، کاتێک گوێی لە دەنگی وەڵامی خۆی بوو، دەنگێک کە بێگومان و چەندوچوون هەر دەنگەکەی جارانی خۆی بوو. بەڵام زیکەیەکی ئازاراوی، کە وەک ئەوەی لە خوارەوە بێت و سەرکوت نەکرێت خۆی لەگەڵ دەنگیدا تێکەڵ کردبوو و تەنها لە سەرەتادا ڕێی بە ڕوونی و ئاشکرایی وشەکان دەدا و لە کۆتاییدا بە شێوەیەک دەیشێواندن، کە مرۆڤ گومانی لە خۆی دەکرد ئەو وشانەی بە دروستی بیستبێت. **گریگۆر** ویستبووی بە وردی وەڵام بداتەوە و هەموو شتێک ڕوون بکاتەوە، بەڵام لەو بارودۆخەدا قسەکانی خۆی

لەوەدا سنووردار کرد کە بڵێت: «بەڵێ بەڵێ، سوپاس دایە، وا هەڵدەستم.»
هەڵبەت بە هۆی دەرگا تەختەکەوە ئەو گۆڕانەی بەسەر دەنگی **گریگۆر**دا هاتبوو لە دیوی دەرەوەوە هەستی پێ نەدەکرا، چونکە دایکی بەو قسانە ئارام بووەوە و ڕۆیشت. بەڵام بە هۆی ئەو گفتوگۆیە چکۆلانەیەوە ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکە ئاگادار بوونەوە، کە **گریگۆر** بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی ئەوانەوە هێشتا لەماڵدایە. هیچی نەخایاند و باوکیشی لە دەرگا لاوەکییەکەی دا، بە ئەسپایی، بەڵام بە مست. بانگی لە **گریگۆر** کرد:
«**گریگۆر**، **گریگۆر**، ئەوە چییە؟» و پاش ساتێک جارێکی دیکە بە دەنگێکی گڕ ئاگاداری کردەوە: «**گریگۆر**، **گریگۆر**!»
بەڵام لەودیو دەرگا لاوەکییەکەی دیکەشەوە خوشکەکەی بە دەنگێکی نزم دەینووزاند:
«**گریگۆر**؟ حاڵت باش نییە؟ پێویستت بە شتێک نییە؟»
**گریگۆر**یش بە ڕووی هەردوو لایەکەدا گوتی: «وا ئامادەم» و تەقەلای بوو لە ڕێی دانپێدانانێکی دروست بە وشەکاندا و مەودادانێکی درێژ لە بەینی تاقەوشەکاندا هەر گۆڕانکارییەکی زەق، کە بەسەر دەنگیدا هاتبوو، نەهێڵێت.
باوکیشی گەڕایەوە سەر بەرچاییەکەی خۆی، بەڵام خوشکەکەی هەر دەیچرپاند:
«**گریگۆر**، توخوا بیکەرەوە.»

بەڵام **گریگۆر** هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە دەرگاکە بکاتەوە، بەڵکوو هەر لە گەشتەکانییەوە فێر بووبوو، شەوان تەنانەت لە ماڵی خۆشیان هەموو دەرگاکان کلیل بدات.

سەرەتا ویستی بە ئارامی و بێ ئەوەی کەس بێزاری بکات هەستێت و خۆی لەبەر بکات و بەرچایی بخوات و پاشان بیر لە دواتر بکاتەوە، چونکە هەڵبەت هەستی بەوە کردبوو کە لەسەر جێگا نەدەگەیشتە ئەنجامێکی ژیرانە. ئێستا لە یادی بوو، زۆر جار لەسەر جێگا بە هۆی درێژبوونێکی نەزانانەوە هەستی بە ئازارێکی ئەسپایی کردبێت، بەڵام ئازارێک کە پاش هەستان وەک وەهمێک وابووبێت و هەنووکەش بە تەوسەوە چاوەڕوان بوو چۆن پەیتاپەیتا وەهمەکانی ئەمڕۆی کۆتایی دێن. ئەو وای دادەنا کە گۆڕانەکەی ناو دەنگی جگە لە ئاماژەیەک بۆ سەرمابوون، یان هەر نەخۆشییەکی ئاسایی دیکە کە گەشتیاران تووشی دێن، هیچی دیکە نییە، لەوەدا بچووکترین گومانی نەبوو.

فڕێدانی پێخەفەکە زۆر ئاسان بوو، تەنها دەبایە کەمێک هێز بداتە خۆی، ئیدی پێخەفەکە خۆی خزایە خوارێ. بەڵام شتەکان لەوەبەدوا سەخت بوون، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە جەستەی هێندە پان بوو، بۆ هەستانەسەرپێ پێویستی بە دەست و قۆڵ بوو، بەڵام لە بری ئەوە خاوەنی ژمارەیەکی زۆر قاچی چکۆلانە بوو، کە بێوچان

لە جووڵەی جیاواز جیاوازدا بوون و سەرەڕای ئەوەش **گریگۆر** دەسەڵاتی بەسەریاندا نەبوو.
کاتێک دەیویست یەکێک لە قاچەکانی بنووشتێنێتەوە، ئەوا یەکەمجار لە بری ئەوە دەکشایەوە و دواتر دەیتوانی ئەو شتە بە قاچی بکات کە خۆی دەیویست. لەو نێوەندەدا قاچەکانی دیکەی، وەک ئەوەی ئازاد کرابن، بە ئازار و ورووژاوییەکی زۆرەوە کەوتبوونە جووڵە. **گریگۆر** بە خۆی دەگوت: «هەر بێسوود لەژێر جێدا نەمێنییەوە!»
سەرەتا ویستی بە بەشی خوارەوەی جەستەی سەرجێگاکە بەجێ بهێڵێت، بەڵام بۆی دەرکەوت بەشی خوارەوەی، کە بۆ تێبینیتان هێشتا خۆی نەیبینیبوو و لە توانایدا نەبوو وێنایەکی دروستی لە بارەوە هەبێت، ئێجگار سەخت دەجووڵێنرا؛ زۆر بە کاوەخۆیی دەجووڵا و دواجار کاتێک وەک ئەوەی دڕ بووبێت، هەموو هێزی خۆی کۆ کردەوە و بەبێ چەندوچونکاری خۆی بەرەو پێش پاڵنا، بەڵام ئاڕاستەیەکی هەڵەی هەڵبژاردبوو و خۆی بە توندی دا بە قاچی خوارەوەی سیسەمەکەدا و ئەو ئازارە سووتێنەرەی کە هەستی پێکرد، دەرسی دەدا، کە لەم ئانوساتەدا بەشی خوارەوەی جەستەی هەستیارترین جێی بوو.
لەبەر ئەوە هەوڵی دا سەرەتا بەشی سەرەوەی جەستەی لەژێر جێگاکە بەدەرخات و لەسەرخۆ سەری سووڕاند و ڕووی کردە قەراخ جێگاکە. ئەوەی بە ئاسانی پێکرا و

سەرەڕای پانی و سەنگینییەکەی، چێوەی جەستەی دوابەداوی سەری سوورڕا. بەڵام کە دواجار سەری لە دەرەوەی جێگاکەی بە حەواوە ڕاگرت، نەیوێرا بەو شێوەیە بەردەوام بێت، چونکە ئەگەر دواجار بەو شێوەیە خۆی فڕێ بدایەتە خوارێ، دەبایە پەرجوویەک ڕوو بدات، تاوەکوو سەری بریندار نەبێت. ئێستاش بە هیچ شێوەیەک نەدەبوو لە هۆش خۆی بچێت؛ ئەگەرنا هەر چاتر بوو لەژێر جێگادا بمێنێتەوە.

بەڵام کاتێک پاش هەمان زەحمەت وەک پێشتر لەسەر جێگاکە درێژ بووەوە و سەرلەنوێ قاچە چکۆلانەکانی خۆی بینییەوە، کە بەرامبەر یەک دەجەنگین و خۆیشی هیچ چارەیەکی نەدەدۆزییەوە، تاوەکوو بتوانێت ئارامی بگەڕێنێتەوە، هەمدیس بە خۆی گوتەوە، ناشێت لەژێر جێگادا بمێنێتەوە و ژیرانەترین شت ئەوەیە، هەموو شتێک بکاتە قوربانی، گەر بێت و ترووسکە هیوایەک لە ئارادا هەبێت، تا بتوانێت خۆی لە جێگاکەی ڕزگار بکات. بەڵام هەمان کاتیش ئەوەی فەرامۆش نەکرد، تاوناتاوێک بە بیری خۆی بهێنێتەوە، کە لە بڕیاری گوماناوی باشتر، تێفکرینی بەکاوەخۆ و هێمنە. لەو ساتانەدا هەتا لە توانایدا بایە بە تیژی ڕووی چاوەکانی لە پەنجەرەکە دەکرد، بەڵام دیمەنی تەمومژەکەی ئەو بەیانییە، کە تەنانەت ئەوبەری شەقامە تەنگەکەی ڕووپۆش کردبوو، گەشبینی و هۆشیاری پێ نەدەبەخشی. لە چرکەی سەرلەنوێی میلی

کاتژمێرەکەدا بە خۆی گوت: «کاتژمێر حەوت بووە، حەوت بووە و هێشتا تەمومژێکی ئاوەهایە.» و بۆ ساتێک بە نەفەسێکی ئارامەوە لەویادا پاڵ کەوتبوو، وەک ئەوەی چاوەڕوانیی گەڕانەوەی جیهانی ڕاستەقینە و ڕۆتینی لەو بێدەنگییە بکات.

بەڵام پاشان بەخۆی گوت: «بەرلەوەی چارەگی بویت بۆ هەشت، پێویستە جێگاکەم بە تەواوی جێهێشتبێت. هەتا ئەو وەختەش یەکێک لە دوکانەوە دێت، تاکوو سەروسۆراخم بکات، چونکە دوکان بەر لە کاتژمێر حەوت دەکرێتەوە.» خۆی بۆ ئەوە ئامادە کرد، بە تەواوی جەستەیەوە لەسەر یەک ئیقاع و پێکڕا جێگەی خەوەکەی چۆڵ بکات. ئەگەر بەو شێوەیە لەسەر جێگاکەیەوە خۆی بخزاندایەتە خوارێ، ئەوا سەری بریندار نەدەبوو، چونکە دەیویست لە ساتی کەوتنەکەدا سەری بڵند بکات. لەوەدەچوو پشتی ڕەقەڵە بێت؛ هەڵبەت گەر بکەوتایەتە سەر فەرشەکە پشتی هیچی لێ نەدەهات. زۆرتر بیری لەو زرمە گەورەیە دەکردەوە، کە دەبوو کەوتنەکەی بیکات و گەر لە پشت هەموو دەرگاکانەوە تۆقاندنی ئەوانی دیکەی لێ نەکەوتایەتەوە، ئەوا لانیکەم خەمی لێ دەکەوتەوە. بەڵام پێویست بوو زاتی ئەو ڕیسکە بکات.

کاتێک **گریگۆر** نیوەی جەستەی لەسەر سیسەمەکەوە دەرچووبوو– ئەم ڕێگا نوێیەیان پتر یارییەک بوو وەک لەوەی سەخت بێت، تەنها پێویست بوو بە گوژم تەکان

بدات-، بە بیری هاتەوە، هەموو شتێک چەند ئاسان دەبوو گەر بهاتنایە بۆ کۆمەکی. دوو کەسی بەهێز- **گریگۆر** بیری لە باوکی و کچە خزمەتکارەکە دەکردەوە- بە ئاسانی بەشیان دەکرد؛ تەنها پێویست بوو دەستیان بخەنە ژێر پشتە کەوانەییەکەیەوە، لەسەر جێگاکەیەوە هەڵیبڕن و بەو کێشەوە بچەمێنەوە و ئیدی بەکاوەخۆ لێگەڕێن بەسەر **ئەرزەکەدا** پان بێتەوە و بە هیوای ئەوەی قاچۆچکەکان دوایی ڕۆڵی خۆیان ببینن. ئایا دەبایە ئێستا، گەر دەرگاکان دانەخرابانایە، هاواری کۆمەک بکات؟ لەگەڵ ئەو فکرەدا، سەرەڕای ئەو هەموو لێقەوماوییە، بزەی دەهات و لە توانایدا نەبوو بزەکەی سەرکوت بکات.

ئێستا کار گەیشتبووە ئەوەی گەر گوژمی توندتری بە خۆی بدایە ئەوا لە توانایدا نەدەما لەنگەری جەستەی خۆی ڕاگرێت، ئیدی دەبایە بەم زوانە خۆی تەواو یەکلایی بکاتەوە، چونکە پاش پێنج خولەکی دیکە کاتژمێر دەبووە هەشت چارەک کەم.

کاتێک زەنگی دەرگای خانووەکە لێ درا، بە خۆی گوت: «ئەوە یەکێکە لە دوکانەوە هاتووە.» و وەخت بوو لە جێی خۆیدا ڕەق دەبوو و قاچە چکۆلانەکانی هێندەی دیکە خێراتر هەلەکەسەمایان بوو. بۆ ساتێک هەموو شتێک خامۆش بوو. **گریگۆر**، بە داڵغەی هیوایەکی بێماناوە بە خۆی گوت: «دەرگاکە ناکەنەوە.»

بەڵام پاشان وەک هەمیشە کچە خزمەتکارەکە بە هەنگاوی گورجوگۆڵەوە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و کردییەوە. **گریگۆر** تەنها هێندەی پێویست کرد یەکەم وشەی سڵاوی میوانەکە ببیستێت، ئیدی زانی کێیە- نوێنەری کۆمپانیاکە بە تایبەتی خۆی هاتبوو. بۆچی **گریگۆر** بەوە مەحکووم بوو لای کۆمپانیایەک کارمەند بێت، کە لە بچووکترین دواکەوتندا مەزنترین گومانی لێ بکەن؟ ئایا هەموو کارمەندەکان پێکڕا بەدفەڕگەلێک بوون، ئایا لەناویاندا کەسێکی دڵسۆز نەبوو، کە ئەگەر چەند کاتژمێرێکی بەیانی لە پێناوی کۆمپانیاکەدا نەقۆزێتەوە، ئەوا لەتاو سەرزەنشتی ویژدانی شێت بێت و تەنانەت لە توانایدا نەبێت سەرجێگاکەی خۆی جێبهێڵێت؟ ئایا بەڕاستی بەس نەبوو، شاگردێک بنێرن سۆراخی بکات- گەر هەرگیز پێویستی بەو پرسیار و پرسیارکارییە بکردایە-، ئایا دەبایە نوێنەرەکە خۆی بە تایبەتی تەشریف بهێنێت و لە ڕێی ئەوەوە بە تەواوی خێزانە بێخەتاکەی نیشان بدات، کە لێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلە گومانلێکراوە تەنها دەکرێت بە عەقڵی خودی نوێنەری کۆمپانیاکە ڕابسپێردرێت؟ پتر بە هۆی ئەو وروژاوییەی کە **گریگۆر** بە هۆی ئەو فکرانەوە خۆی تێدا دەبینییەوە وەک لە بڕیارێکی ڕاستەقینە، بە هەموو هێزییەوە، خۆی لە جێگای خەوەکەی دەرپەڕاند. تەپەیەکی توند هات، بەڵام تەقەوڕەقەیەکی ڕاستەقینە نەبوو. بەربوونەوەکەی بە هۆی فەرشەکەوە

کەمێک لاوازتر بوو، هەروەها پشتیشی لەو ڕادەیە پانتر بوو کە **گریگۆر** بیری لێ کردبووەوە، بۆیە زرمەیەکی کپی لێوە هات، کە زۆر سەرنجی دەوروبەری ڕانەکێشا. تەنها سەری وەک پێویست بەئاگاوە ڕانەگرتبوو و دابووی بە ئەرزەکەدا؛ سەری هەڵسووڕاند و لە تووڕەیی و ئازاردا لە فەرشەکەی دەخشاند.

لە هۆدەکەی تەنیشتەوە بە دەستە چەپدا نوێنەرەکە گوتی: «لەو ژوورەدا شتێک بەربووەوە.»

**گریگۆر** هەوڵی دەدا بیهێنێتە پێش چاوی، ئاخۆ نەدەشیا شتێکی لەو جۆرە کە ئەمڕۆ لە خۆی ڕووی دابوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە نوێنەرەکەش بقەومێت؛ خۆ مرۆڤ دەبایە لە ڕاستیدا لانیکەم دان بە بوونی ئەوەدا بنێت.

بەڵام وەک بۆ بەرپەرچدانەوەیەکی توندی ئەو پرسیارە، ئێستا نوێنەرەکە لە هۆدەکەی تەنیشتەوە چەند هەنگاوێکی دیاریکراوی هەڵهێنایەوە و بە پووتەکانی کرتەی لە ئەرزەکە هەستاند. لە ژوورەکەی دەستی چەپەوە خوشکەکەی دەیچرپاند، تاکوو شتێک لە **گریگۆر** بگەیەنێت: «**گریگۆر**، نوێنەرەکە لێرەیە.»

**گریگۆر** لەبەر خۆیەوە گوتی: «دەزانم.» بەڵام زاتی نەکرد دەنگی هێندە بڵند بکات، کە خوشکەکەی گوێی لێ بێت.

ئێستا باوک لە هۆدەکەی دەستەچەپەوە دەیگوت: «کاکی نوێنەر لێرەیە و دەپرسێت، ئاخۆ بە شەمەندەفەرەکەی سەرلەبەیانی نەڕۆیشتوویت. ئێمە نازانین چی پێ بڵێین.

کەسێکی هێند سەرسەختە. دڵنیاشم حاڵی باش نییە، ئەگەرچی لە بەیانییەوە حاشای لێ دەکات.»

**گریگۆر** بەکاوەخۆ و تێڕامانەوە گوتی: «هەر ئێستا دێم» و جووڵەی لێوە نەهات، تاوەکوو یەک وشەی گفتوگۆکانی لە قیس نەچێت.

نوێنەرکە گوتی: «خانمی بەڕێز گەروا نەبێت بەڕاستی منیش هیچ ڕوونکردنەوەیەکم بۆی نییە. هیوادارم نەخۆشییەکی سەخت نەبێت. ئەگەرچی پێویستە لەلایەکی دیکەشەوە ئەوە بڵێم کە دەبێت ئێمەی بازرگان- جا ئیدی ئەوە چ شتێکی خۆشبەختانە بێت یان جێی داخ بێت- گوێ بە خەراپحاڵییە ئاسانەکان نەدەین.»

دووبارە باوکە بێسەبرەکەی لە دەرگاکەی دایەوە و پرسی: «کەوابێ ئێستا کاکی نوێنەر دەتوانێت بێتە ژووری بۆ لات؟»

**گریگۆر** گوتی: «نەخێر.»

لە ژوورەکەی تەنیشتی بە دەستەچەپدا بێدەنگییەکی شەرمەزارانە هاتە کایەوە، لە ژووری تەنیشتی بە دەستەڕاستدا خوشکەکەی کەوتە هەنیسکدان.

ئایا بۆچی خوشکەکەی نەدەڕۆیشتە لای ئەوانی دی؟ هەڵبەت ئێستا لە جێگاکەی بەدەر کەوتبوو و جارێ خۆی لەبەر نەکردبوو. ئەی بۆچی دەگریا؟ لەبەر ئەوەی ئەم هەڵنەدەستا و بواری بە نوێنەرەکە نەدەدا بێتە ژوورەوە، لەبەر ئەوەی لە مەترسیی ئەوەدا بوو ئیشەکەی لە دەست

بدات و ئیدی خاوەنکارەکەی بە داواکانی ئەوسایەوە شوێن دایک و باوکی بکەوێتەوە؟ هەڵبەت ئەو خەمانە بۆ ئەم ئانوساتە نابەجێ بوون. **گریگۆر** هێشتا لێرە بوو و بە کەمترین ڕادە بیری لەوە نەدەکردەوە خێزانەکەی خۆی بەجێ بهێڵێت. لەو لەحزەیەدا لەسەر ئەو فەرشە کەوتبوو و هیچ کەسێکیش، گەر ئاگاداری بارودۆخی بوایە، داوای لێ نەدەکرد بوار بە هاتنەژوورەوەی نوێنەرەکە بدات. بەڵام بە هۆی ئەو بێڕێزییە بچووکەوە، کە دەکرا دواتر بە ئاسانی بیانوویەکی شیاوی بۆ بدۆزێتەوە، دەستبەجێ لە کارەکەی دەرنەدەکرا. **گریگۆر** پێشی وا بوو، زۆر ژیرانەتر دەبوو بە هێمنی لێی گەڕێن، وەک لەوەی بە گریان و قسە بێزاری بکەن. بەڵام ئیدی گومانێک لە ئارادا هەبوو، کە تەنگی بەوانی دیکە هەڵچنیبوو و ئەو هەڵسوکەوتەی لێ کەوتبووەوە.

نوێنەرەکە بە دەنگی بەرزەوە گوتی: «بەڕێز **سامزا**، چی ڕووی داوە؟ ئێوە لە ژوورەکەتاندا دەرگاتان لەسەر خۆتان داخستووە و تەنها بە بەڵێ و نەخێر وەڵام دەدەنەوە، بوونەتە مایەی خەمێکی ناپێویست بۆ دایک و باوکتان و- ئەمە تەنها لە پەراوێزدا دەڵێم- بە دوای ئەرکەکانی کارەکانتاندا ناچن و لە ڕاستیدا بە شێوەیەکی بێشەرمانەش ئەم کردارە دەنوێنن. من لێرەدا بە ناوی دایک و باوکتان و خاوەنکارەکەتانەوە قسە دەکەم و بە جددی دەستبەجێ داوای ڕوونکردنەوەیەکی ڕوون و

ئاشکراتان لێ دەکەم. پێم سەیرە، پێم سەیرە. من وام دەناسین کە ئێوە مرۆڤێکی ئارام و ژیر بن، بەڵام ئێستا وا دێنە پێش چاوم تازە بکەونە ئەوەی بە میزاجی سەیروسەمەرەوە خۆتان بنوێنن. لە ڕاستیدا خاوەنکارەکەتان ئەم بەیانییە ئاماژەی ڕوونکردنەوەیەکی شیاوی دامێ- باس باسی ئەو بڕەپارەیە بوو، کە لەمێژ نییە پێتان سپێردراوە-، بەڵام من بەڕاستی پەیمانی شەرەفم دایە کە ئەو ڕوونکردنەوەیە ڕاست نییە. بەڵام ئێستا لێرەدا ئەو سەرسەختییەتان دەبینم، کە جێی حاڵیبوون نییە و هەر ئارەزوویەک بۆ کەمترین پشتگیری لە ئێوە لە دەست دەدەم. شوێنکارەکەشتان شوێنکارێکی زۆر مسۆگەر نییە. من پێشوەخت نیازم هەبوو دووبەدوو ئەو شتانەتان پێ بڵێم، بەڵام بەوەدا کە ئێوە بێسوود کاتم لێدەگرن، ئیدی نازانم بۆچی دایک و باوکیشتانی لێ ئاگادار نەکەمەوە. کارەکانتان لەم ماوەیەی پێشووەوە کەموکوڕن. لە ڕاستیدا ئێستا وەرزی بازرگانییەکی باش نییە، ئێمە دان بەوەدا دەنێین، بەڵام وەرزی بێ مامەڵە بوونی نییە و نابێت بوونی هەبێت، بەڕێز **سامزا**.»

**گریگۆر** ئۆقرەی لێ بڕا و لە تاوان هەموو شتێکی دیکەی فەرامۆش کرد و هاواری کرد: «بەڵام کاکی نوێنەر، من هەر ئێستە دەستبەجێ دەرگاکە دەکەمەوە. ناڕەحەتییەکی سووک، سەرلەگێژەوەچوونێک ڕێیان لێگرتم هەستم. من هێشتا لەژێر جێگادام. بەڵام ئێستا زیندوو بوومەتەوە.

ئێستا لە جێگاکەم هەڵدەستم. تەنها چرکەیەک سەبرتان هەبێت! هێشتا بەو ئاسانییەی کە بیرم لێ کردبووەوە ناکرێت. بەڵام حاڵم باشە. ئای ئەوە چۆن بەو جۆرە لە مرۆڤ دەقەومێت! هەتا دوێنێشەو کەموکوڕیم نەبوو، خۆ دایک و باوکم دەزانن یاخود باشتر بڵێم، هەر لە دوێنێ ئێوارەوە هەستم بە شتێک کردبوو. دەبایە لە ڕووخسارم ببینرایە. بۆچی کۆگام لێ ئاگادار نەکردەوە؟! بەڵام مرۆڤ هەمیشە وا دەزانێت دەتوانێت نەخۆشییەک بەبێ مانەوە لە ماڵەوە ببەزێنێت، کاکی نوێنەر! لە دایک و باوکم گەڕێن! هیچ هۆکارێک نییە بۆ هەموو ئەو شتانەی بەسەر منیدا دەهێنن، خۆ من هیچم پێ نەگوتراوە. ئێوە ڕەنگە ئەو ڕاسپاردانەتان نەخوێندبێتەوە کە من لەم دواییەدا ناردوومن. بۆ زانیاریتان، هەر بە شەمەندەفەری کاتژمێر هەشت دەردەچم، بەو چەند کاتژمێری ئارامییە هێز هاتووەتەوە بەرم. تەنها ڕێم لێ نەگرن، کاکی نوێنەر. من خۆم پاش کەمێک لە دوکان دەبم و ئێوەش ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکەن، ئەوە بگەیەنن و لای کاکی خاوەنکارەکەم دوو قسەی باشم بۆ بکەن!»

لە کاتێکدا **گریگۆر** هەموو ئەم شتانەی لە دەم دەرپەڕی و بە ئاستەمیش دەیزانی خۆی چی دەڵێت، هەڵبەت بە هۆی ئەو ڕاهێنانەوەی کە لەسەر جێگای خەوەکەی کردبووی، بە ئاسانی خۆی لە سندووقەکە نزیک کردەوە و هەوڵی دا خۆی پێوە هەستێنێت. بەڕاستی دەیویست دەرگاکە

بکاتەوە، بەڕاستی دەیویست بوار بدات ئەوان ببینن و لەگەڵ نوێنەرەکەدا بدوێت؛ عەودالّی ئەوە بوو بزانێت، ئەوانی دی کە ئێستا بەم شێوەیە داوای ئەمیان دەکرد، لە دیتنی دیمەنیدا چی دەڵێن. گەر بتۆقینایە، ئەوا **گریگۆر** چیتر بەرپرسیار نەدەبوو و دەیتوانی ئارام بێت. بەڵام گەر هەموو شتێکیان بە ئارامی وەرگرتبایە، ئەوا ئەمیش هۆیەکی نەدەبوو بەوجۆرە بشڵەژێت و گەر پەلەی بکردایە دەیتوانی بەڕاستی کاتژمێر هەشت لە وێستگەی شەمەندەفەر بێت.

سەرەتا چەند جارێک لە سندووقەکە هەڵخلیسکا، بەڵام دواجار دواهەمین گوڕی بە خۆی دا و بە قینجی ڕاوەستا؛ چیتر گوێی نەدەدا بە ئازارەکانی بەشی خوارەوەی جەستەی لەگەڵ ئەوەی زۆریش دەچووزانەوە. ئێستا خۆی بەسەر پاڵپشتی قەنەفەیەکی نزیکەوە دا و بە قاچە چکۆلانەکانی، توند خۆی بە قەراغەکانییەوە گرت. بەڵام بەو کارەش فەرمانڕەوایی بەسەر جەستەی خۆیدا بەدەست نەهێنابوو و بێدەنگ بوو، چونکە ئێستا دەیتوانی گوێ بۆ نوێنەرەکە ڕادێرێت.

نوێنەرەکە لە دایک و باوکی پرسی:

«ئێوە یەک وشە چییە تێگەیشتن؟ ناکا بە شێتمان بزانێت؟»

دایکی بە گریەگرییەوە دەنگی لێ بەرز بووەوە: «بۆ خاتری خوا، ڕەنگە نەخۆشییەکی سەختی گرتبێت و ئێمەش لێرەوە عەزابی بدەین.»

پاشان هاواری لە **گریتە** کرد: «گریتە، گریتە!»

خوشکەکەی **گریگۆر** لە دیوەکەی کەوە دەنگی لێوە هەستا: «دایە؟»

بەناو ژوورەکەی **گریگۆر**دا دەنگیان دەگەیشتە یەکدی.

«پێویستە دەستبەجێ بگەیتە لای دکتۆر، **گریگۆر** نەخۆشە، پەلە لە دکتۆرەکە بکە، ئێستا گوێت لە دەنگی **گریگۆر** نەبوو؟»

نوێنەرەکە بە دەنگێک، کە لە بەرابەر هاوارکردنی دایکەکەدا ئێجگار کز بوو، گوتی: «ئەوە دەنگی ئاژەڵ بوو.»

باوکی بەناو هۆدەکەی پێشەوەدا بانگی لە **ئانا** کرد: «ئانا! ئانا!» و چەپڵەیەکی لێ دا، «بڕۆ دەستبەجێ قفڵسازێک بهێنە!»

بێدواکەوتن دوو کچەکە، کە تەنوورەکانیان گڤەیان دەهات، بەناو ژوورەکەی پێشەوەدا تێپەڕین و دەرگاکەیان کردەوە؟ ئایا خوشکەکەی چۆن هێند خێرا خۆی لەبەر کردبوو؟ ئەسڵەن گوێبستی زرمەی دەرگاکە نەبوویت، دیارە لەسەر پشت جێیانهێشتبوو، هەڵبەت ئەوە شتێکە، هەمیشە لەناو ئەو خانوانەدا ڕوو دەدات، کە کارەساتێکی گەورەیان تێدا ڕووی داوە.

**گریگۆر** هێندەی دیکە برسی بوو. کەوابێ چیدی لە قسەکانی تێنەدەگەیشتن، ئەگەرچی بەشی خۆی ڕوون، تەنانەت ڕوونتر لە جاران هاتبوونە بەر گوێی خۆی، ڕەنگە هۆکارەکەی بۆ ڕاهاتنی گوێیەکانی گەڕابێتەوە. بەڵام هیچ نەبێت باوەڕیان وابوو ساغ نییە و ئامادە بوون کۆمەکی بکەن. دووبارە هەستی بەوە دەکرد کێش کرابێتەوە ناو بازنەی ئادەمیزادی و هیوای کار و سەرکەوتنی مەزن و سەرسووڕهێنی بە قفڵساز و دکتۆرەکەش بوو، لە ڕاستیدا بێ ئەوەی بە دروستی لێکیان جودا بکاتەوە. کەمێک خۆی کۆکاند، تاکوو بۆ ئەو گفتوگۆ یەکلاییکەرانەوە، کە لە پێشی بوون، هەتا لە توانایدا بوو دەنگێکی ڕوون و ئاشکرا بە دەست بهێنێت، بەڵام تەقەلای بوو ئەوە تەواو کپ و بێدەنگی بکات، چونکە ڕێی تێ دەچوو دەنگی کۆخەکەشی لە دەنگی کۆخەی ئادەمیزاد جیاواز بێت؛ شتێک خۆیشی چیتر زاتی نەدەکرد بڕیاری لەسەر بدات. لەو نێوەندەدا ژوورەکەی تەنیشتی تەواو بێدەنگ کەوتبوو. ڕەنگ بوو دایک و باوکی لەگەڵ نوێنەرەکەدا لەبەر مێزەکەدا دانیشتبێتن و چرپەیان بێت، ڕەنگ بوو هەموان سەریان بە دەرگاکەوە نابێت و گوێیان ڕادێرابێت.

**گریگۆر** بە قەنەفەکەوە هێواش هێواش خۆی بەرەو ڕووی دەرگاکە خشاند، لەوێ قەنەفەکەی بەردا، خۆی بەرەو دەرگاکە فڕێ دا و خۆی بە دەرگاکەوە قینج ڕاگرت و-

ژێرپێی قاچە چکۆلانەکانی ماددەیەکی لیکن و شیلەیان پێوە بوو- لەوێ لەحزەیەک لەو خۆماندووکردنە حەوایەوە. بەڵام پاشان کەوتە ئەوەی بە دەم کلیلی ناو کیلۆنەکە بادات. بەداخەوە دەرکەوت، کە خاوەنی ددانی ڕاستەقینە نییە،- ئایا دەبایە بە کوێی کلیلەکە بگرێت؟- بەڵام لە بری ئەوە کاکیلەکانی زۆر بەهێز بوون؛ بە کۆمەکی ئەوان کلیلەکەی بەڕاستی هێنایە جووڵە و گوێی نەدەدا بەوەی کە بێشک زیان بە خۆی دەگەیەنێت، چونکە شلەمەنییەکی قاوەیی لە دەمییەوە هاتە دەر، بەسەر کلیلەکەدا دارڕژا و دڵۆپەی کردە سەر ئەرزەکە.

نوێنەرەکە لە ژوورەکەی پەنایەوە گوتی: «گوێ بگرن، کلیلەکە دەسوورێنێت.»

ئەوە بۆ **گریگۆر** ورەبەخشییەکی گەورە بوو؛ بەڵام دەبایە هەموان بانگیان لێ بکردبایە، دایک و باوکیشی، هاواریان بکردایە: «ئافەرم **گریگۆر**، پەیتاپەیتا نزیک بەوە، لە کیلۆنەکە نزیک بەرەوە!»

لەگەڵ وێنای ئەوەدا کە هەموان بە تەوسەوە شوێن تەقەلاکانی کەوتبن، بە هەموو ئەو هێزەوە کە لە توانایدا بوو کۆی بکاتەوە، قەپاڵی لە کلیلەکە گیر کرد. بە پێی جووڵە و سووڕانی کلیلەکە سەمای بە دەوری کیلۆنەکەدا دەکرد؛ لەم ئانوساتەدا تەنها بە دەمی خۆی بە پێوە ڕاگرتبوو و ئیدی بە پێی پێویست خۆی بە کلیلەکەوە هەڵدەواسی یاخود بە تەواوی کێشی جەستەی کلیلەکەی

بەرەو خوارێ کێشی دەکرد. قرتەیەکی ڕوونتر کە لە گەڕانەوەی دواجاری کیلۆنەکە هات و **گریگۆری** بەڕاستی هۆشیار کردەوە. بە هەناسە هەڵکێشانێکەوە بە خۆی وت: «کەوابێ پێویستیم بە کیلۆنسازەکە نەبوو» و سەری هاویشتە سەر دەسکی دەرگاکە، تاوەکوو دەرگاکە بە تەواوی بکاتەوە.

بەوەدا کە پێویست بوو دەرگاکە بەو شێوەیە بکاتەوە، لە ڕاستیدا دەرگاکە تا ڕادەیەکی بەرین کەوتە سەر پشت و خۆی هێشتا نەدەبینرا. سەرەتا دەبایە زۆر لەسەرخۆ بە دەوری باڵی دەرگاکەدا هەڵسووڕێت، ئەمەش زۆر بەئاگاوە، ئەگەر نەیویستایە ڕێک لە پێش دەروازەکەدا بە پشتا بکەوێت. ئەو هێشتا سەرقاڵی ئەو جووڵە سەختە بوو و کاتی نەبوو، گوێ بداتە شتی دیکە و ئالەویادا گوێی لە نوێنەرەکە بوو «ئۆها!»یکی لێوە هات– دەنگی وەک ڕەشەبایەک هات و ئێستا **گریگۆریش** ئەوی دەبینی، کە لە هەموو ئەوانی دیکە لە دەرگاکە نێزیکتر بوو و دەستی نایە سەر دەمی داچەقاوی و هێواش هێواش لێی کشایەوە، وەک ئەوەی هێزێکی نادیار و یەکئیقاع و بەردەوام ڕاوی بنێت. ئەی دایکی– سەرەڕای ئامادەگیی نوێنەرەکە بە سەروقژێکی هەڵئاوساوەوە، کە هۆکارەکەی بۆ شەوی ڕابردوو دەگەڕایەوە، لەویادا وەستابوو– سەرەتا بە دەست و قۆڵی قەدکراوەوە لە باوکی **گریگۆری** ڕوانی، پاشان دوو هەنگاو بەرەو **گریگۆر** ڕۆیشت لە

ناوەڕاستی تەنوورەکەیدا، کە بە دەوریدا بڵاو بووبووەوە، کەوتە سەر زەوی، سەری هەتا ڕادەی حەشاردان بەناو سینەی خۆیدا نغرۆ کرد. باوکی بە ڕووخسارێکی دوژمنکارانەوە مستی خڕ کرد، وەک ئەوەی بیەوێت بە پاڵ **گرێگۆر** ڕەوانەی ژوورەکەی خۆی بکاتەوە، پاشان لەناو ژووری میوانەکەدا بە گومانەوە لە چواردەوری خۆی ڕوانی، ئیدی دەستەکانی نووساند بە دەموچاوییەوە و کەوتە گریانێک، کە سینە پان و بەهێزەکەی دەلەرزاند.

ئێستا **گرێگۆر** پێی نەنایە ناو ئەو ژوورەوە، بەڵکوو لە دیوی ناوەوە پاڵی دایەوە بە باڵی دەرگاکەوە، بە شێوەیەک تەنها نیوەی جەستەیی و سەری دەبینران، سەری بەلادا خستبوو و بەو شێوەیە تەماشای ئەوانی دەکرد. لەو نێوەندەدا دنیا ڕۆشنتر بووبوو؛ بێگومان بەوبەری شەقامەکەوە بەشێک لە بینایەکی ناکۆتای ڕەشی خۆڵەمێشی دیار بوو- کە نەخۆشخانە بوو- بەو پەنجەرانەیەوە کە بە شێوازێکی یەکڕیتمی و سەرسەختانە سنووریان بەزاندبوو و ڕوویان دەرپەڕاندبووە پێشێ؛ هێشتا باران دەباری، بەڵام بە دڵۆپەی گەورەوە، کە تاک تاک دیار بوون و بەڕاستییش تاک تاک دەیاندا بە زەویدا. قاپوقاچاخێکی زیاد لە پێویستی بەرچایی لەسەر مێزەکە کەوتبوو، چونکە بۆ باوکی **گرێگۆر** نانی بەیانی گرنگترین ژەمی ڕۆژ بوو، کە لەگەڵ خوێندنەوەی چەند ڕۆژنامەیەکی جیاوازجیاوازدا

درێژەی پێ دەدا. ڕێک بەسەر دیوارەکەی بەرامبەرەوە وێنەیەکی سەردەمی سەربازیی **گریگۆر** هەڵواسرابوو، کە **گریگۆری** وەک ئەفسەرێکی دووئەستێرە دەناساند، دەستی بە چەکەکەیەوە بوو، بە بزەیەکی بێخەمەوە، بە پۆز و بەرکە سەربازیەکانییەوە حورمەتی خۆی بەسەردا دەسەپاندی. دەرگای هۆدەکەی پێشەوە کراوەبوو و لەبەرئەوەی دەرگای ماڵەکە لەسەر پشت بوو، مرۆڤ بەردەمی دەرگای دەرێ و سەرەتای ئەو پلیکانانەی دەبینی، کە بەرەو خوار شۆڕ دەبوونەوە.

هەڵبەت **گریگۆر** لەوە هۆشدار بوو، کە ئەو تاکەکەسە ئارامیی خۆی لەدەست نەداوە، گوتی: «ئیدی ئێستا خۆم دەگۆڕم، شتومەکەکان کۆ دەکەمەوە و دەڕۆم. دەتانەوێت، دەتانەوێت لێمگەڕێن بڕۆم؟ ئیدی کاکی نوێنەر ئێستا دەبینن، من کەللەڕەق نیم و حەز لە کار دەکەم؛ گەشتکردن سەختە، بەڵام من بەبێ گەشت ئەسڵەن ناژیم. ئەوە بۆ کوێ دەڕۆن، کاکی نوێنەر؟ بۆ دوکان؟ ها؟ هەموو شتێک وەک خۆی دەگێڕنەوە؟ مرۆڤ دەشێت لەم ئانوساتەدا لە توانایدا نەبێت کار بکات، بەڵام ئێستا کتومت کاتی ئەوەیە توانا و کارەکانی ئەوسام بە یاد بێتەوە و بیر لەوە بکەمەوە، کە دواتر لە پاش لەناوبردنی ئەم بەربەستە، چاپوکتر و پوختتر کار بکەم. من زۆر قەرزاری بەڕێزی خاوەنکارمم، خۆ خۆتان ئەوە باش دەزانن. لەلایەکی دیکەوە خەمی دایک و باوکم و خوشکەکەمە.

تووشی مەخسەرە بووم، بەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان خۆم دەرباز دەکەم. بەڵام لێم قورستر مەکەن. لە دوکان لایەنی من بگرن! ئەوان کوڕی گەشتیارەکەیان خۆش ناوێت، دەزانم. پێیان وایە کۆڵێک پارە پەیدا دەکات و لەگەڵ ئەوەدا ژیانێکی خۆش دەباتە سەر. ئیدی هۆیەکی تایبەتیان نییە، تاوەکوو حوکمێکی پێشوەخت بەسەرمدا نەدەن. بەڵام، ئێوە، کاکی نوێنەر، ئێوە زیاتر لە ماباقی ستافەکە ئاگاداری دۆخەکەن، زیاتر لە خودی کاکی خاوەنکار خۆیشی، کە لە خاسیەتی بەڕێوەبەریی خۆیدا زۆر بە ئاسانی لە حوکمێکدا لە زەرەری کرێکار خۆی بە سەهودان دەدات. هەڵبەت دەشزانن، گەشتیار، کە نزیکەی سەراسەری ساڵ لە دەرەوەی دوکانەکەدایە، زۆر ئاسان و زووزوو دەبێتە قوربانیی فیتنە و فیتنەکاری و ڕێکەوت و سکاڵای بێهۆکار، کە ئەستەمە بتوانێت بەرگری لە خۆی بکات، لەبەر ئەوەی هەرگیز شتێکیان لێوە نابیستێت و گەر شتێکیشی پێ بڵێن ئەوە لە کاتێکدایە ئەو ماندوو و شەکەت لە گەشتێکەوە گەڕابێتەوە و لە ماڵەوە بە جەستەی خۆی هەست بەو دەرەنجامە خراپانە بکات، کە هۆکارەکانی چیتر سەرەوبەرەیان نەماوە. کاکی نوێنەر، مەڕۆن بێ ئەوەی وشەیەکتان پێ گوتبم، کە نیشانم بدات، لانیکەم من لە بەشێکی بچووکدا لەسەر هەقم!»

بەڵام نوێنەرەکە هەر لەگەڵ یەکەمین وشەکانی **گریگۆردا** پشتی تێ کردبوو و بەسەر شانی هەڵتەکیوییەوە و بە

دەمی داچەقیوەوە ڕووی لە دواوە کردبوو و لە **گریگۆری** دەڕوانی. لە کاتی تەواوی قسەکانی **گریگۆر**دا بۆ یەک لەحزە چییە ئارام نەوەستا، بەڵکوو بێ ئەوەی چاو لەسەر **گریگۆر** لا بدات خۆی بەرەو دەرگاکە کێش دەکرد، بەڵام پەیتاپەیتا، وەک ئەوەی قەدەغەیەکی نهێنی بۆ جێهێشتنیماڵەکە سەروەر بێت. ئێستا گەیشتبووە ناو داڵانەکە و لە پاش جووڵەیەکی لەناکاو، کە بۆ دواهەمین جار پێی لە ژووری میوانەکە دەرکێشایە دەرێ، مرۆڤ بڕوای وا بوو هەر ئێستا بنەپێی سووتاوە. بەڵام لە داڵانەکەدا دەستی ڕاستی تەواو بەرەو پلیکانەکان درێژ کرد، وەک ئەوەی لەوێ نەجاتبوون و پاکبوونەوەیەکی مەلەکوتی چاوەڕێی بکات.

**گریگۆر** هاتبووە قەناعەت، گەر بیویستایە کارەکەی لە کۆگاکە نەکەوێتە ئەوپەڕی مەترسییەوە نەدەبوو بە هیچ شێوەیەک بوار بدات نوێنەرەکە بەو بارودۆخەوە بڕوات، دایک و باوکی زۆر بەباشی لە هەموو ئەو شتانە حاڵی نەدەبوون؛ لە ڕەوتی ئەو ساڵە دووروودرێژانەدا قەناعەتێکیان لە خەیاڵی خۆیاندا خولقاندبوو، کە **گریگۆر** لەو دوکانەدا بۆ تەواوی ماباقی ژیانی مشورخوراوە و سەرەڕای ئەوەش ئێستا بەم خەمە ئانوساتییانەی خۆیانەوە زۆر سەرقاڵ بوون، بەشێوەیەک، کە هەموو دووربینییەکیان لەدەستدابوو. بەڵام **گریگۆر** خاوەنی ئەو دووربینییە بوو. پێویست بوو نوێنەرەکە ڕابگیرێت، ئارام

بکرێتەوە و ڕازی بکرێت و بکرێتە لایەنگرێک؛ خۆ ئیدی دواڕۆژی **گریگۆر** و تەواوی خێزانەکەی بەوەوە بەند بوو! بریا خوشکەکەی لێرە بایە! خوشکەکەی ژیر بوو؛ هەر ئەوکات کە **گریگۆر** بە ئارامی لەسەر پشت کەوتبوو، ئەو گریابوو. بێگومانیش نوێنەرەکە، ئەو خانمدۆستە بواری دەدا خوشکەکەی **گریگۆر** کەوی بکات؛ خوشکەکەی دەرگای خانووەکەی دادەخست و لەناو دالانەکەدا ترسەکەی لێ دەردەکرد. بەڵام خوشکەکەی لێرە نەبوو، دەبایە **گریگۆر** خۆی شتێک بکات.

بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، کە تواناکانی جووڵانی خۆی هێشتا ناناسێت، هەرگیز بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، کە ڕەنگ بوو، زۆر لەوانەبوو دووبارە لە قسەکانی تێنەگەیشتبنەوە، باڵی دەرگاکەی بەجێ هێشت؛ بەناو دەروازەکەدا خۆی کێش کرد، ویستی بڕواتە لای نوێنەرەکە، کە بە شێوازێکی بێمانا و دەستەپاچانە بە هەردوو دەستی خۆی توند بە محاجەرەی پێش ماڵەکەوە گرتبوو. بەڵام **گریگۆر** بەدوای شتێکدا دەگەڕا خۆی پێوە بگرێت و دەستبەجێ بە هاوارێکەوە بەسەر قاچە چکۆلانە و زۆرەکانی خۆیدا کەوت. لەگەڵ ئەوەی ڕووی دا، بۆ یەکەمین جار لەو بەیانییەدا هەستی بە ئاسوودەییەکی جەستەیی کرد؛ قاچە گچکۆکەکانی لەسەر زەوییەکە توند خۆیان گرتبوو، بۆ مایەی خۆشحاڵیی خۆی هەستی پێ کرد، کە تەواو گوێڕایەڵنی، تەنانەت لە تەقەلای ئەوەدا

بوون هەڵیبگرن و بیگوێزنەوە بۆ هەر شوێنێک کە خۆی بیەوێت. هەر لە ئێستاوە بڕوای وابوو چابوونەوەی دواجاری هەموو ئازار و ناڵەکان لە پێشیدایە. بەڵام لە هەمان چرکەدا، کاتێک لەویادا بە نیازی وەستان لە جووڵەجووڵ، بەلارەلار، زۆر دوور لە دایکی نا بەڵکوو بەرامبەری درێژ بووبوو، دایکی کە لە ڕاستیدا هێند قووڵ لەناو خۆدی خۆیدا نغرۆ بووبوو داچڵەکی و هەڵبەزییەوە، بە پەل و پەنجەی لێکبڵاوەوە ناڵاندی: «هاوار، بۆ خاتری خوا هاوار!»، سەری داخست، وەک ئەوەی ویستبێتی **گریگۆر** باشتر ببینێت، بەڵام بۆ مایەی ناکۆکی بە شێوازێکی بێمانایانە پاشەکشێی کردەوە، بیری چووبووەوە کە مێزەکە لە پشتییەوەیەتی، کە گەیشتە لای مێزەکە وەک ئەوەی لە داڵغەدا بێت بە پەلە لەسەری دانیشت و هەرگیز لەوە نەدەچوو هەستی بەوە کردبێت، کە بە تەنیشتییەوە لە کەترییە گەورەکەوە کە پەڕیبووە سەر ئەرزەکە، قاوە بە جۆگەلە دەڕژێتە سەر فەرشەکە.

**گریگۆر** بە ئەسپایی گوتی: «دایە، دایە،» و سەری هەڵبڕی و لێی ڕوانی. بۆ لەحزەیەک نوێنەرەکە تەواو لە خەیاڵیدا نەمابوو. لە دیمەنی قاوە ڕژاوەکەدا خۆی پێ نەگیرا و چەند جارێک قەپاڵی لە بەتاڵایی دا. بەسەر ئەوەدا دایکی سەرلەنوێ قیژاندییەوە و لە مێزەکەوە هەڵهات و کەوتە ئامێزی باوکی **گریگۆر**ەوە، کە بە هەڵەداوان بەرەوڕووی دەهات. بەڵام **گریگۆر** ئێستا کاتی نەبوو بۆ دایک و باوکی،

پەردەکانی سەر پەنجەرەکان بەرز دەبوونەوە، ڕۆژنامەکانی سەر مێزەکە دەیانخشپاند، تاک تاک پەڕە بەسەر زەوییەکەدا دەفڕین. باوکی بێڕەحمانە تینی هێنابوو و وەک دڕندەیەک فیشکەی لێوە دەهات. بەڵام **گرێگۆر** هێشتا لە بەگدانان ڕانەهاتبوو، بەڕاستی زۆر بە هێواشی دەڕۆیشت. گەر **گرێگۆر** تەنها بیتوانیبایە بسووڕێت، ئەوا دەستبەجێ دەگەیشتە ناو ژوورەکەی خۆی، بەڵام دەترسا بە سووڕانەوەیەکی وەختکوژ سەبر لە باوکی ببڕێت و هەر لەحزەیەک هەڕەشەی لەسەر بوو گۆچانەکەی دەستی باوکی بدات بە پشتی یان بە سەریدا. بەڵام دواجار **گرێگۆر** هیچی دیکەی بۆ نەمایەوە، چونکە بە نیگەرانییەوە هەستی بەوە کرد، کە لە ڕێکردنی پشتاوپشتدا تەنانەت لەوەشی نەدەزانی ئاڕاستەکەی خۆی ڕاگرێت و بەو شێوەیە لەگەڵ تیلەچاویکرندێکی ترسنۆکانەی بێوچان لە باوکی پەلەی هەلێکی بوو بسووڕێت و بەڕاستی زۆر بە هیواشی سووڕا. ڕەنگە باوکی پەی بە مەبەستی باشی **گرێگۆر** بردبێت، چونکە لێی تێک نەدا بەڵکوو لێرەولەوێ لە دوورەوە بە سەری گۆچانەکە سەرپەرشتیی جووڵەکانی دەکرد.

گەر ئەو فیشکەفیشکە ئۆقرەبڕەی باوکی نەدەبوو! **گرێگۆر** بە تەواوی مێشکی لە دەست دابوو. وەختبوو تەواو خۆی دەسووڕاند، کاتێک هەمیشە لەژێر گوێڕایەڵیی ئەو فیشکەفیشکەدا سەری لێ شێوا و دووبارە کەمێکی دیکە

سووڕایەوە. بەڵام کاتێک خۆشحاڵانە سەری لە ڕێکی دەروازەکە بوو، ئاشکرا بوو کە جەستەی ئێجگار پانوپۆڕ بوو هەتاوەکوو بێکێشە پێیدا بچێت. بێگومان باوکیشی لە دۆخی ئەو ساتەیدا ئەسڵەن بە خەیاڵیدا نەهات، باڵەکەی دیکەی دەرگاکە بکاتەوە، تاکوو جێگەی تەواو بۆ **گریگۆر** بکاتەوە. فکرە جێگیرەکەی ئەوە بوو هەتا زووە **گریگۆر** ڕاو بنێتەوە ناو ژوورەکەی خۆیەوە. هەرگیز بواری ئەو ئامادەکارییە سەختەی نەدەدا، کە **گریگۆر** پێویستی بوو هەتاکوو بتوانێت قینج بێتەوە و بەو شێوەیە بە دەرگاکەدا بچێت. زیاتر بە دەنگەدەنگێکی زۆرەوە **گریگۆری** ڕاو دەنا، وەک ئەوەی هیچ بەربەستێک نەبێت. لە پشت **گریگۆرەوە** چیتر وەک دەنگی تاکە باوکێک نەدەهاتە بەر گوێ، ئێستا مەسەلەکە بەڕاستی ناخۆش بووبوو و **گریگۆریش**– چی دەبێت با ببێت– خۆی لەناو دەرگاکە خزاندبوو. لایەکی جەستەی بەرز بوو، **گریگۆر** بە خواری لەناو دەرگاکەدا بوو، دیوێکی جەستەی بە تەواوی زامدار بووبوو، پەڵەی دزێو و ناحەز بەسەر دەرگا سپییەکەوە بەجێ مان، هەر زوو گیری خوارد و لە توانایدا نەبوو بە تەنها بجووڵێت. قاچە چکۆلەکانی لە دیوێکییەوە بە حەواوە دەلەرزین، ئەوانی دیوەکەی دیکەی بە ئازارەوە بە زەوییەکەوە فلیقێنرابوون– لەویادا باوکی پاڵێکی فریادڕەسانەی پێوە نا و ئەمیش دوور پەڕییە ناو ژوورەکەی خۆیەوە. خوێنێکی زۆری لێ دەڕۆیشت. دەرگاکەی هەر بە گۆچانەکە داخستەوە، ئیدی دواجار دنیا بێدەنگ بوو.

# بەشی دووەم

سەرەتا سەرلەئێوارە **گریگۆر** لە خەوە قورسە بێهۆشئاساکەی بەخەبەر هات. بێگومان بێ خەولێتێکدانیش زۆر درەنگتر بەخەبەر نەدەهات، چونکە هەستی دەکرد تەواو حەواوەتەوە و تێرخەو بووە. بەڵام وای دەهاتە پێش چاو، بە هەنگاوێکی کورت و خێرا و داخستنێکی بەکاوەخۆی ئەو دەرگایە بەخەبەر هاتبێت، کە دەڕۆیشتەوە سەر دالانەکە. شەوقی گڵۆپە کارەباییەکانی سەر شەقامەکە لێرەولەوێ بە ڕەنگێکی سپیهەڵگەڕاو بەژێر سەقفەکە و بەسەر بەشە بڵندەکانی مۆبیلیاتەکانەوە بوون، بەڵام لە خوارەوە لای **گریگۆر** تاریک بوو. بە هێواشی لە ڕێی جووڵانێکی هێشتا نەزانانەی هەستەوەرەکانییەوە، کە تازە فێر دەبوو قەدریان بزانێت، خۆی بەرەو دەرگاکە کێش کرد، تاکوو تەماشا بکات، ئاخۆ لەوێ چی ڕووی داوە. لای چەپی تاکەزامێکی نارەحەتی جەڕێن و درێژکەڵە بوو و دەبایە لەسەر دوو ڕیزە قاچەکانی هەنگەشەلە بکات. یەکێک لە قاچە چکۆلانەکانی لە ڕەوتی ڕووداوەکانی پێشنیوەڕۆدا بە سەختی بریندار ببووبوو و بێگیان بە دوایەوە دەخشا- وەک پەرجوویەک وا بوو، کە تەنها یەکێکیان زامدار ببووبوو-

سەرەتا لای دەرگاکە هەستی کرد کە لەڕاستیدا چی شتێک کێشی ئەوێی کردبوو؛ بۆنی خواردن بوو. چونکە لەوێ قاپێکی قوڵ پڕ کرابوو لە شیری شیرینکراو و پارچە چکۆلەی سەمونی سپی تێگوشرابوو. وەخت بوو لە خۆشیاندا پێدەکەنی، چونکە لە بەیانی زیاتر برسی بوو و دەستبەجێ هەتا سەر چاوەکانی سەری لەناو شیرەکەدا نقوم کرد. بەڵام هەر زوو نائومێدانە سەری دەرهێنایەوە؛ نەک تەنها لەبەر ئەوەی کە نان خواردن لەبەر دیوە ناهەموارەکەی چەپی کێشەی بۆ دروست دەکرد- ئەو تەنها کاتێک تەواوی جەستەی بە هەناسەوە کاری لەگەڵ بکردایە دەیتوانی نان بخوات- سەرەڕای ئەوەش تامی شیرەکەی، کە هەمیشە خوشەویستترین خواردنەوەی **گریگۆر** بوو و بێگومان هەر لەبەر ئەوەش خوشکەکەی بۆی دانابووە ژوورێ، هیچ پێ خۆش نەبوو. بەڵێ **گریگۆر** بە پرۆتەستەوە پشتی لە قاپەکە کرد و کشایەوە ناوەڕاستی ژوورەکەوە.

وەک **گریگۆر** لە درزی دەرگاکەوە دەیبینی، لە ژووری میوانەکە غازەکە داگیرسێنرابوو، بەڵام لەکاتێکدا وەک هەمیشە لەو ساتەوەختەی ڕۆژدا باوکی ڕۆژنامەی دوانیوەڕۆی بۆ دایکی و هەندێک جار خوشکەکەی بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە، ئێستا یەک دەنگ چییە نەدەهات. بەڵام ڕەنگیش بوو ئەو خوێندنەوەیە، کە خوشکەکەی بۆی دەگێڕایەوە و لە نامەکانیدا باسی دەکرد، لەم ماوەیەی

ڕابردوودا تەواو فەرامۆش کرابێت. بەڵام چواردەوریشی بێدەنگ بوو، ئەگەرچی بە دڵنیاییەوە ناو خانوەکە چۆڵ نەبوو.
**گریگۆر** بە خۆی گوت: «ئەم خێزانە چ ژیانێکی بێدەنگ دەژین» و لەکاتێکدا لەبەر خۆیەوە چاوی لە زوڵمەت بڕیبوو، هەستی بە شانازیەکی گەورە کرد، کە توانیبووی ژیانێکی ئاوها لەناو ئەپارتمانێکی هێند قەشەنگدا بۆ دایک و باوکی و خوشکەکەی بسازێنێت. بەڵام چۆن دەبوو، ئەگەر ئێستا هەموو ئارامی و خۆشگوزەرانی و ئاسوودەییەک بە کارەسات کۆتایی بهاتایە؟ تاکو خۆی لەناو خەیاڵگەلێکی ئاوهادا ون نەکات کەوتەوە جوڵە و خشۆکانە بەناو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو.
بە درێژایی ئەو ئێوارەیە جارێک باڵێکی دەرگاکە و جارێک باڵێکی دیکەی تا ڕادەی درزێکی بچکۆلە کرایەوە و بەپەلە داخرایەوە، هەڵبەت کەسێک دەیویست بێتە ژوورەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گومانی ئێجگار زۆر بوو. ئێستا **گریگۆر** دروست لەپێش دەرگای ژووری میوانەکەدا وەستا، بڕیاریدا بە هەر شێوەیەک بێت میوانە بەگومانەکە بهێنێتە ژوورێ یاخود هیچ نەبێت بزانێت کێیە؛ بەڵام ئیدی دەرگاکە چیدیکە نەکرایەوە و **گریگۆر** بێهەدەر چاوەڕێبوو. زوو، کاتێک دەرگاکان دادەخران هەمووان دەیانویست بێنە ژوورێ بۆ لای **گریگۆر**، ئێستاش، لەکاتێکدا یەکێک لە دەرگاکانی کردبووەوە و هەڵبەت ئەوانی دیکەش لە

ڕەوتی ئەم ڕۆژەدا کرابووەنەوە، چیدی کەس نەدەهات و کلیلەکانیش لە دیوی دەرەوەوە لەناو کونی کیلۆنەکەدا بوون.
سەرەتا شەو درەنگ گلۆپی ژووری میوانەکە کوژێنرایەوە و ئێستا بە ئاسانی بۆی دەرکەوت، کە دایک و باوک و خوشکەکەی هەتا درەنگ بەخەبەر مابوونەوە، چونکە وەکو ئێستا گوێی لێ بوو، هەمووان لە سەر نوکە پێ دوور کەوتنەوە. هەنووکە بە دڵنیاییەوە هەتا بەیانی چیدی کەس نەدەهاتە لای گریگۆر؛ بەوپێیە کاتێکی درێژی بۆ بیرکردنەوە لەبەردەستدا بوو، ئاخۆ چۆن یاسایەکی نوێ بە ژیانی بدات. بەڵام ژوورە بەتاڵە بەرزەکەی، کە ناچار بوو تیایدا بە تەختی لەسەر ئەرزەکە درێژ بێت، دەیترساند بێئەوەی بتوانێت بچێتە بنج و بناوانی هۆکارەکەیەوە، چونکە ماوەی پێنج ساڵ بوو لەو ژوورەدا دەژیا- بە وەچەرخانێکی نیمچە ناخودئاگایانە و زۆر شەرمەزارانە پەلەی کرد و خزییە ژێر قەنەفەکەوە و لەوێ، ئەگەرچی پشتی کەمێک فشاری لەسەر بوو و چیدی نەیدەتوانی سەر بڵند بکات، هەستی بە ئاسوودەیەکی زۆر دەکرد و پێی ئەفسووس بوو، کە جەستەی ئێجگار پانە هەتا بەتەواوەتی لەژێر قەنەفەکەدا جێ بۆ خۆی بکاتەوە.
سەراسەری شەو لەویادا مایەوە، کە بەشێکی بە نیمچە خەوتووی تیادا بەسەر برد و برسێتییەکەی چەندین جار دایدەچڵەکاندەوە، بەڵام بەشێکیشی لە خەم و هیواگەلێکی

لیلدا بەسەربرد، کە دەیانگەیاندە ئەنجامی ئەوەی، دەبێت هەڵسوکەوتی ئێستاکەی ئارام بێت و لەڕێی سەبر و ڕەچاوکردنی زۆری خێزانەکەیەوە ئەو نارەحەتیانە ئاسانتر بکات، کە بەم بارودۆخەی ئێستای بە شێوازێکی بێچارانە بەسەر خێزانەکەیدا هێنابوو.

هەر بەیانی زوو، هێشتا دەتگوت شەوە، **گرێگۆر** هەلی ئەوەی هەبوو هێزی ئەو بڕیارانەی تاقی بکاتەوە، کە تازە دابوونی، چونکە لە دالانەکەوە خوشکەکەی کە شتێکی تەنکی لەبەردا بوو، دەرگاکەی کردەوە و بە تەوسەوە چاوی لە ژووری کرد. دەستبەجێ **گرێگۆری** نەدۆزیەوە، بەڵام کاتێک لەژێر قەنەفەکەدا هەستی پێ کرد و- خودایە، خۆ دەبایە لە شوێنێکی ژوورەکەدا بێت، خۆ نەیتوانیبوو بفڕێت- بە شێوەیەک تۆقی کە دەستبەجێ بێئەوەی خۆی پێ کۆنترۆڵ بکرێت دەرگاکەی لەدیوی دەرەوەوە داخستەوە. بەڵام وەک ئەوەی لەو هەڵسوکەوتەی پەشیمان بێت، دەستبەجێ دەرگاکەی سەرلەنوێ کردەوە و وەک ئەوەی لای نەخۆشێکی سەخت یاخود تەنانەت لای غەریبەیەک بێت، لەسەر نووکی پێ هاتە ژووری. **گرێگۆر** هەتا ئاستی قەراغی قەنفەکە سەری دەرهێنابوو و چاودێریی دەکرد. ئاخۆ هەستی پێ کردبێت کە **گرێگۆر** شیرەکەی لێ ماوەتەوە و لەڕاستیدا بەهیچ جۆرێک لەبەر نەبوونی برسییەتی نییە و ئاخۆ جۆرە خواردنێکی دیکەی بۆ دەهێنایە ژووری، کە بۆ ئەم شیاوتر بێت؟ گەر

سەربەخۆ ئەوەی نەکردایە، ئەوا پێی باشتر بوو لە برسان بمرێت وەک لەوەی ئاگاداری بکاتەوە، ئەگەرچی تەواو تینی بۆ هاتبوو لەژێر قەنەفەکەوە دەرپەڕێت، خۆی فڕێداتە بەرپێی خوشکەکەی و داوای شتێکی خواردنی باشی لێ بکات. بەڵام خوشکەکەی دەستبەجێ بە سەرسوڕمانەوە هەستی بە قاپە پڕەکە کرد کە بە چواردەوریدا تەنها کەمێک شیر ڕژابوو، دەستبەجێ قاپەکەی هەڵگرتەوە و بردییە دەرەوە، بە دەستی بەتاڵیش نا، بەڵکو بە پارچە پەڕۆیەک. **گریگۆر** هەتا لوتکە بێئۆقرە بوو، ئاخۆ چی شتێک لەجێی ئەوە دەهێنێت و هەمەجۆرترین خەیاڵی سەبارەت بەوە دەهێنا و دەبرد.
بەڵام هەرگیز لەوە دڵنیا نەبوو کە خوشکەکەی لە چاکی خۆیدا چی دەکرد. بۆ ئەوەی زەوقی تاقی بکاتەوە، هەڵبژاردەیەکی تەواوی بۆ هێنا، هەمووی لەسەر ڕۆژنامەیەکی کۆن بڵاوکردەوە. سەوزەواتی کۆنی نیمچە گەنیوی تیادا بوو، ئێسقان کە لە ژەمی ئێوارە مابووەوە کە سۆسی سپی توند دەوری گرتبوو، چەند دەنکێک کشمیش و بادەم، پارچەیەک پەنیر، کە **گریگۆر** خۆی پێش دوو ڕۆژ بە بێتام لە قەڵەمی دابوو، سەمونێکی وشک، سەمونێکی سوێرکراو کە کەرەی پێوە سیواخدرابوو. سەرەڕای ئەوەش بە تەنیشت هەموو ئەو شتانەوە قاپولکەیەکی قوڵی بۆ دانا، کە ڕەنگ بوو یەکەم و ئەخیر جارەکی بۆ **گریگۆری** دیاریکردبێت، ئاوی لە قاپولکەکە

کردبوو. چونکە خۆی هێندە هەستی ناسک بوو دەیزانی **گریگۆر** لەپێش چاویدا ناخوات، زۆر بە پەلە دوور کەوتەوە و تەنانەت لە پشت دەرگاکەوە کلیلەکەی بادا، تاکو **گریگۆر** هەست بکات، کە چۆنی دەوێت ئاوەها ئاسوودە بێت. کاتێک مەسەلە کەوتە سەر نان خواردن، قاچە بچووکەکانی بڵاوبوونەوە. دەبوو زامەکانیشی تەواو چاک بووبێتنەوە، چیدیکە هەستی بە بەربەست نەدەکرد. سەری دەسوڕما و بیری دەکردەوە کە مانگێک لەوەوبەر بە چەقۆیەک پەنجەی خۆی بڕیبوو و زامەکەی هەتا دوێنێش ئازاری هاتبوو.

بیری دەکردەوە: «دەبێت ئێستا هەستیاریم کەمی کردبێت؟» و بە تەماحەوە پەنیرەکەی دەمژی، کە لە هەموو خواردنەکەی دیکە زیاتر **گریگۆری** بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. بە خێرایی و بێوچان و بە چاوی فرمێسکاویەوە، کە لە ئاسوودەییدا ئاویان کردبوو، پەنیر و سەوزەوات و سۆسەکەی هەڵلوشی؛ بە پێچەوانەوە خواردەمەنییە تازەکان تامیان خۆش نەبوو، تەنانەت بەرگەی بۆنەکەشی نەدەگرتن و تەنانەت ئەو شتانەشی کەمێک لێ دوورخستنەوە کە دەیوسیت بیانخوات.

کاتێک خۆشکەکەی بۆ ئاماژەدانی ئەوەی **گریگۆر** بکشێتەوە کلیلەکەی هێواش هێواش بادا، **گریگۆر** لەمێژ بوو لە هەموو شتێک تەواو بووبوو و بە تەمەڵی لە هەمان جێگادا درێژ بووبوو. دەستبەجێ داچڵەکی. ئەگەرچی

وەخت بوو خەو دەیبردەوە بە پەلە چووەوە ژێر قەنەفەکە. بەڵام جەنگێکی دەروونی بوو، تاکو بۆ ئەو ماوەیەی خوشکەکەی لە ژوورەکەیدا بوو، لەژێر قەنەفەکەدا بمێنێتەوە، چونکە جەستەی بەو خواردنە زۆرە کەمێک خڕ ببوو و ئیدی لەو تەنگییەدا بە ئاستەم توانای هەناسەدانی هەبوو.

بە هەناسەبڕکێی کورتکورتەوە چاوی کەمێک دەرپەڕاندبوو و تەماشای خوشکە هیچ نەزانەکەی دەکرد، چۆن بە گسکێک نەک تەنها بەرماوەکان، بەڵکو ئەو خواردنانەشی دەماڵی کە **گریگۆر** هێشتا هەر دەستی بەریان نەکەوتبوو، وەک ئەوەی ئەوانەش هەر بەکەڵک نەمابن، وەک چۆن بە پەلەپەلیش هەمووی خستە زبڵدانێکەوە و بە سەرە تەختەیەک دایخست و پاشان هەمووی بردە دەرێ. لەگەڵ پشتی تێکرد **گریگۆر** لەژێر قەنەفەکە بەدەرکەوت و خۆی کێشیاوە و خۆی پف دا.

بەو شێوەیە **گریگۆر** ڕۆژانە خواردنەکەی خۆی وەردەگرت، ژەمێک بەیانیان، کاتێک دایک و باوکی و کچە خزمەتکارەکە هێشتا نووستبوون و ژەمی دووهەمیش لەپاش نانی نیوەڕۆ، چونکە ئەوکاتیش دایک و باوکی بۆ ساتێک دەخەوتن، کچە خزمەتکارەکەش لەلایەن خوشکەکەیەوە بۆ کڕینی شتێک دەنێردرایە دەرێ. بێگومان ئەوانیش نەیاندەویست **گریگۆر** لە برسا بمرێت، بەڵام ڕەنگبوو بەرگەی ئەوەیان نەگرتایە کە لە دەنگۆ

زیاتر هیچ شتێکی دیکە سەبارەت بە خواردنی **گریگۆر** بزانن. لەبەرئەوەی لە **گریگۆر** حاڵی نەدەبوون و کەس بیری لەوە نەدەکردەوە، تەنانەت خوشکەکەشی بیری لەوە نەدەکردەوە کە **گریگۆر** لەوان تێدەگات، بەو شێوەیە دەبایە بەوە ڕاببوێرێت کە لێرە و لەوێ گوێی لە هەناسە هەڵکێشان و بانگێکی خوشکەکەی بێت لە شەخسە پیرۆز و موبارەکەکان. دواتر، کاتێک خوشکەکەی وەخت بوو لەسەر هەموو شتەکان ڕادەهات- بێگومان ڕاهاتنی تەواو هەرگیز کردە نەبوو- جارناجارێک **گریگۆر** گوێی لە تێبینییەک دەبوو، کە مەبەستێکی دۆستانەی لە پشتەوە بوو یاخود دەشیا بەو شێوەیە تەفسیر بکرێت، کە **گریگۆر** چاپوکانە خواردنەکانی نۆشکردایە، دەیگوت: «ئێ ئەمڕۆ خواردنەکەی بەدڵ بووە«، و لە حاڵەتی پێچەوانەدا، شتێک کە زوو زوو دووبارە دەبووەوە، غەمبارانە دەیگووت: «دیسانەوە هیچی لێ نەخواردووە.»

بەڵام لەکاتێکدا **گریگۆر** نەیدەتوانی هەواڵە نوێیەکان بزانێت، چەند شتێکی لە ژوورەکانی تەنیشتەوە دەبیست و کاتێک گوێی لە دەنگێک دەبوو، دەستبەجێ دەڕۆیشتە لای دەرگای ئەو ژوورەی کە دەنگەکەی لێوە دەهات و تەواوی جەستەی پێوە دەنووساند. بەتایبەتی لەسەرەتادا گفتوگۆیەک لەئارادا نەبوو، کە بەجۆرێک لە جۆرەکان، ئەگەرچی بە نهێنیش بووبێت، سەبارەت بە خۆی نەبێت. ماوەی دوو ڕۆژ لەسەر هەموو ژەمەکان گوێی لە

ڕاوێژیگەلێک دەبوو، کە ئاخۆ دەبایە ئێستا چۆن هەڵسوکەوت بکەن، بەڵام لەنێوان ژەمەکانیشدا هەمان باس تاووتوێ دەکرا، چونکە هەردەم لانی کەم دوو ئەندامی خێزان لەماڵەوە بوون، هەڵبەت لەبەرئەوەی کەس نەیدەویست بە تەنها لە ماڵەوە بێت و بە هیچ شێوەیەکیش نەدەکرا پێکڕا ماڵ بەجێبهێڵن. هەروەها کچە خزمەتکارەکەش لە یەکەم ڕۆژدا- ئاشکرا نەبوو چی و چەندی سەبارەت بە ڕووداوەکە دەزانی- ڕۆیشتبووە سەر ئەژنۆ و تکای لە دایکی **گریگۆر** کردبوو دەستبەجێ ئیزنی بدات و کاتێک پاش چارەگێک ماڵئاوایی کرد، بە فرمێسکەوە بۆ ئیزندانەکەی سوپاسی کردن، وەک سوپاسکردنێک بۆ چاکەیەکی گەورە، کە لێرەدا لەگەڵی کرابێت و بێئەوەی داوایان لێکردبێت سوێندی خوارد، کەمترین شت لای یەک کەس نەدرکێنێت.

ئێستا دەبایە خوشکەکەشی بە ڕێکەوتن لەگەڵ دایکدا چێشت لێبنێت، بەڵام ئەوە زەحمەتێکی زۆر نەبوو، چونکە لەوێ نان زۆر نەدەخورا. **گریگۆر** چەندین جار گوێی لێ دەبوو، کە یەکێک فەرمانی بە یەکێکی دی دەکرد نان بخوات و هیچ وەڵامێکی دیکەی جگە لە »سوپاس، تێرم« یاخود شتێکی لەو جۆرەی وەرنەدەگرتەوە. ڕەنگ بوو هیچیش نەخۆنەوە. زوو زوو خوشکەکەی لە باوکی دەپرسی، ئاخۆ نایەوێت بیرەیەک بخواتەوە و لە دڵەوە خۆی دەخستە بەردەست کە بۆی بهێنێت و کاتێک باوکی

به بێدەنگی دەمایەوە، دەیگوت دەشتوانێت خزمەتکارەکە بنێرێت، تاوەکو هەموو گومانێک لە مێشکی باوکیدا بنەبڕبکات، بەڵام ئیدی دواجار «نەخێر» ێکی گەورەی دەگوت و چی دیکە باس لەو مەسەلەیە نەدەکرایەوە.

هەر لە ڕەوتی یەکەم ڕۆژدا باوکی تەواوی دۆخە داراییەکان و هیواکانی بۆ دایک و خوشکەکەی **گریگۆر** خستەڕوو. جارناجارێک لەسەر مێزەکە هەڵدەستا و لەو سندوقی حساباتەیدا، کە پێنج ساڵ لەوەو بەر لەپاش شکستهێنانی لە بازرگانی و بەڕێوەبردنی کۆگاکەدا ڕزگاری کردبوو، پسوڵەیەک یاخود دەفتەرێکی مسۆدەی دەردەهێنا. **گریگۆر** گوێی لێبوو، کە چۆن قفڵە ئاڵۆزەکەی دەکردەوە و لەپاش دەرهێنانی ئەو شتەی لەدوای دەگەڕا دایدەخستەوە. ئەو ڕوونکردنەوانەی باوکی یەکەم شتی خۆش بوو، کە **گریگۆر** لە ساتی بەندییەکەیەوە بیستبووی. **گریگۆر** وایزانیبوو باوکی لەو دوکانەوە هیچ شتێکی بۆ نەماوەتەوە، هیچ نەبێت باوکی هیچ شتێکی پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی **گریگۆری** نەدرکاندبوو، بەڵام ئیدی **گریگۆریش** پرسیاری لێ نەکردبوو. ئەوسات تاکە خەمی **گریگۆر** ئەوە بوو، ئەوەی لە توانایدایە بیکات، تاکو هەتا زووە ئەو کارەساتە بازرگانییە، کە هەمووانی خستبووە بێهیواییەکی تەواوەوە، لەبیر خێزانەکەی بەرێتەوە. بەو شێوەیە ئەوکات ناچار بوو بوو بە گوڕێکی تایبەتییەوە دەست بە کار بکات و لەمڕۆوە بۆ سبەی لە سەربازێکەوە بووبووە

گەشتیارێک، کە بێگومان بۆ پارە پەیداکردن هەلگەلێکی دیکەی لەبەر دەستدا بوو و کارەکانی لە شێوەی کۆمیسیۆندا دەبوونە پارەی کاش، کە دەتوانرا لە ماڵەوە لەسەر مێزەکە بخرێتە پێش دەمی خێزانە سەراسیمە و بەختدارەکەی. سەردەمێکی خۆش بووبوو، سەردەمانێک کە هەرگیز بەو باقوبریقییەی جارانیانەوە دووپات نەبووبوونەوە، ئەگەرچی دواتر **گرێگۆر** ئەو هەموو پارەیەی پەیدا دەکرد، کە لەتوانایدا بوو هەموو ئەرکەکانی تەواوی خێزانەکە لە ئەستۆ بگرێت و لە ئەستۆشی گرتبوو. ئیدی لەسەری ڕاهاتبوون، خێزانەکە و **گرێگۆر** خۆشی، بە سوپاسەوە پارەکەیان وەردەگرت، ئەمیش بە خۆشحاڵییەوە پارەکەی پێ دەبەخشین، بەڵام چیدیکە گەرموگوڕییەکی تایبەتی لێ نەدەکەوتەوە. تەنها خوشکەکەی بەینی لەگەڵ **گرێگۆر**دا نزیک مابووەوە، پیلانێکی نهێنی **گرێگۆر** بوو ساڵی داهاتوو خوشکەکەی، کە بەپێچەوانەی **گرێگۆر**ەوە عاشقی مۆسیقا بوو و دەیزانی کەمانچەیەکی قەشەنگ بژەنێت، بنێرێتە زانستگای مۆسیقا، بێئەوەی حیساب بۆ ئەو مەسرەفانە بکات کە دەبایە تێیبچێت و دەکرا بە شێوازێکی دیکە ئەو پارانە پەیدای بکاتەوە. زوو زوو لەکاتی مانەوە کورتخایەنەکانی **گرێگۆر** لە شاردا، لەناو گفتوگۆکاندا باس لە زانسگای مۆسیقی دەکرا، بەڵام هەمیشە وەک خەونێکی خۆش، کە بیر لە هاتنەدی نەدەکرایەوە و دایک و باوکیان تەنانەت